# سیماو سیفەتەکانی خەواریج ؛

- ئەڵقەی سێیەم –

-زانای فەرمووودەناس شیخ عبد العزیز الطریفي؛ خوای گەورە ئازادیکات

و؛ عبد الحکیم رەحیمی



## خەواریج وشەڕ نەکردن لەگەڵ کافران سیفەتێکی گشتییە، بەڵام لە هەموو کاتێکدا پەیوەستیان نییە



شەڕ نەکردنی خەواریج لەگەڵ بت پەرستان وئەهلی کوفر بە گشتی، سیفەتێکی زاڵە بەسەریانەوە، بەڵام مەرج نییە سیفەتێکی پەیوەستی هەموو کات وسەردەمێکی بوونیان بێ. خەواریج هەر کاتێك پەیا بووبن شەڕ وخراپەیان بەرامبەر بە موسوڵمانان ئەوەندە قاتی ئەزیەتدانی کافران بووە، چونکە خەواریج وەك ئەهلی سوننە شەڕی کافری مورتەد وهەڵگەڕاو پێش شەڕی مرۆڤێکی لە ئەسڵ کافرەوە دەخەن، بەڵام ئەوەی خەواریج تێیکەوتوون ئەوەیە کە کێ مورتەدە وکێ مورتەد نییە .

خەواریجەکان لە سەردەمی هاوەڵاندا شەڕیان لەگەڵ برێك موشریك وکافردا کردووە. لە کتێبی ئیمامی موسلیمدا یەزیدی کوڕی هورموز فەرموودەیەك لە ابن عەباسەوە دەگێڕێتەوە، کە "نەجدە"ی خاریجی نامەیەکی بۆ ابن عباس ناردبوو وپرسیاری لە پێنج خەسڵەت دەکرد، ابن عباس فەرمووی: "لە ترسی ئەوە نەبوایە عیلم وزانیاری خۆم بشارمەوە، جوابم نەدەدایەوە"، لە گێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: "لە ترسی ئەوە نەبووایە تووشی هەڵەشە وگەمژەییەك بێ، یەك دانە شتم بۆ نەدەنووسی"، لەو نامەدا نەجدە دەنووسێ: "لە دوادا: ئەوەم بۆ باس کە ئایا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئافرەتی لەگەڵ خۆدا دەبردە شەڕ ؟ دواتر ئەگەر بیبردایـن پشکی لە دەسکەوتەکان بۆ دەهێشتنەوە ؟ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم منالی دەکوشت ؟ کەی منالی هەتیو ئەو قۆناغە تێپەڕ دەکا ؟ پێنج یەکی غەنیمەت بەشی کێیە ؟"، ابن عباس وەڵامی پرسیارەکانی دایەوە وبۆی ڕەوانە کردن .

بۆیە ئەگەر پرسیاری ئەو خەواریجانە بۆ غەنیمەت ودەسکەوتی موسوڵمانان بوایە ابن عباس ئەسڵەن وەڵامی نەدەدانەوە، ئەوەی وای لە ابن عەباسیش کردبوو وەڵامیانداتەوە ئەوە بووە کە پرسیاریان لە غەنیمەتی کافر وموشریکان کردبوو، ئەگینا تاڵانکردنی ماڵی موسوڵمانێك زۆر لە وەڵام نەدانەوەی پرسیارێك وشاردنەوەی زانست وزانیاری گەورەترە، دیارە کە ابن عباس وخوارتریش لە ابن عباس شتی وایان لێ ناشاردرێتەوە .

شەڕی زۆری خەواریجیش لە دژی موسوڵماناندا لەوە وەیە کە بڕوایان بە ریدەت وکوفر وهەڵگەڕانەوەی ئەو موسوڵمانانەیەو، پێیان وایە هەر ئەو موسوڵمانانە لە عیبادەت ویەکتاپەرستی خوادا پێشبڕکێی ورکابەریان دەکەن. کافر دیارە کە ورد ودرشت لە موسوڵمانان جیایە وبانگەشەی یەکخواپەرستی وتەوحیدیش ناکا، بۆیە خەواریج هەوڵدەدەن سەرەتا ریزی ناوخۆ پاك کەنەوەو، هەر ئەوەش هۆکاری زماندرێژی وبەد ڕەفتاریانە بەرامبەر بە زاناو عالمانی ئوممەت وتەنانەت لە عامەتی خەڵکیش پتر بێ ڕیزیان پێ دەکەن، چونکە پێیان وایە ئەو زانایانە لە هەموو کەس زیاتر ڕکابەرییان لە مەسەلەکانی تەوحید وراگرتنی مافی یەکتاپەرستی خوای پەروەردگاردا لەگەڵ دەکەن .

بۆیە "ابن الخويصرة" زۆر توند لەگەڵ پێغەمبەردا ڕەفتاری کردووە، "ابن الكواء" و"عبدالله بن وهب الراسبي" و"ابن ملجم"یش بە هەمان شێوە ڕەفتاریان لەگەڵ ئیمامی عەلیدا کردووە .

شتێکی دیکەش لێرەدا وەك ابن عومەر دەفەرموێت ئەوەی کە خەواریج دەقی کافران لە قورئان وسوننەتدا لەگەڵ موسوڵمانان بە کار دەبەن، چونکە خودی ئەو دەقانە لە پێشتردا مورتەد وهەڵگەڕاوە لە دین دەگرنەوە ولەبەر ئەوەیە کە خەواریج دایدەبەزێننە سەر مورتەد وئەو کەسانەی تەکفیریان کردوون .

لەگەڵ هەموو ئەوەدا، شەڕی خەواریج لە بەرامبەر کافراندا؛ ئەوە نەبووە زانا وپێشەوایان بە خەواریجیان ناو نەبەن، کەوا دەستەو کۆمەڵەیکی دەرچوون بەرامبەر ئیسلام وموسوڵماناندا .

بۆیە فەرموودەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم باسی وەپێشخستنی شەڕی موسوڵمانانی لای خەواریجدا کردووەو، خستنییە بەر دژایەتی کافران وبێ باوەڕان .

شيخ الإسلام ابن تيمية؛ لە باسی شەڕی خەواریجدا لەگەڵ کافران دەڵێ: "کە خەواریج شەڕیان لەگەڵ کافراندا کرد، کۆمەڵە گوناه وتاوانێکی تێدا بە کار دەبەن؛ غەدر دەکەن، جەستەی کوژراوەکانیان دەشێوێنن، دزی وتەعەداکاری دەکەن، تەنانەت بۆ ئەوەی شەڕ لەگەڵ دوژمندا بکەن هێرش دەکەنە سەر برا موسوڵمانەکانیان ودەست بۆ گیان وماڵ وولاتیان درێژ ئەکەنو، برێك لە شێوازی شەڕ کردنی کافرانیان لەگەڵدا بە کار دێنن، بەڵکو لەوانەیە شەڕی موسوڵمانانیان پێ گرنگتر بێ، پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم ئاوا وەسفی کردوون کە دەفەرموێت: "ئەهلی ئیسلام دەکوژنو، ئەهلی بت وپەیکەر ودروستکراوان وێڵ ئەکەن".

بەڵام ئەگەر خەواریج شەڕیان لەگەڵ کافراندا کرد، وەك ئەوەی قیتالی تەعەداکەرانی جوو ودیان وڕافیزە بکەن، جائیز نییە مرۆڤی موسوڵمان هاوکاری دوژمن لە بەرامبەر خەواریجدا بکاتو پشتی ئەو دوژمنە بگرێتو، هیچ یەك لە زاناو عالمانی سەلەف ودوای ئەوانیش ئەم ئیشەیان پێ جائیز نەبووەو، بە هیچ جۆرێك ڕێگەی ئەوە نییە باسی شەڕ کردنی

خەواریج لە فەرموودەی پێغەمبەردا وەرگێڕدرێتەوە سەر یارمەتیدانی کافران لە ڕووی خەواریجدا.



**پێگەی ئیسلامی گزنگ**

Facebook:- @Gizing.net

Telegram:- @GizingNet

١٤٣٨ - ٢٠١٧